پێشکەشە بە:

هەموو منداڵە چاوگەشەکانی

کوردەواری لە هەر کوێ بن


سرشناسه : رحمانی مرانه، نجیبه، ۱۳۴۹-

عنوان و نام پدیدآور : پەلکە/ نەجیبە رەحمانی؛ تصویرگر موسی مرادی

مشخصات نشر : تهران: آنا، ۱۳۸۸.

مشخصات ظاهری : ۲۰ص.: مصور (رنگی).

شابک : ۴-۶۸۷۶-۶۴-۹۶۴-۹۷۸

وضعیت فهرست نویسی : فیپا

یادداشت : کردی

یادداشت : گروه سنی: ج

موضوع : شعر کردی

شناسه افزوده : مرادی، موسی، تصویرگر

رده بندی دیویی : ۱۳۸۸ پ ۳۹۷ رک ۹ فا ۸

شماره کتابشناسی ملی : ۱۷۹۶۷۷۲


نووسەر: نەجیبە رەحمانی

نیگارکێش: مووسا مورادی

بڵاوگە: سنە ـ شەمیم سنە

کۆمپیوتر: سنە ـ ناسێح رەحمانی (پەرتووک)

ئەژمار: ۵۰۰۰ دانە

جار و ساڵی چاپ: یەکەم ۱۳۸۹

نرخ ۴۰۰۰

ناوەندی بڵاوکردنەوە: سنە ـ کتێبی نیشتمان ـ تەلەفوون ۰۸۷۱ ۲۲۷۲۱۱۵

## یاری

یاری لە نێو منداڵان
لەگەڵ هاوڕێ و هاوساڵان
هۆی سروور و شادیە
بەشێک لە ئازادییە
بە قازانجە بۆ جەستە
سەلامەتیم مەبەستە

لە قاروقین ڕقمانە
لە یەک ناگرین بەهانە
یاری یەک ناشێوێنین
دڵی یەک نارەنجێنین
چۆڕێ ئاو ناخۆیینەوە
تاکوو دەحەسیینەوە
پێم خۆشە کاتم شادبێ
پڕ لە یاری و ئازاد بێ

**سفرەکەم**

چاوگەشێکی شیرینم
دایم دەم بە کەنینم
لە کاتی خواردنی نان
دەستوپلم دەشۆم جوان
دێمە سەر سفرە خێرا
دەڵێم بە نێوی خودا
ئەوەی لە سفرە دایە
سوودی بۆ لەش تێدایە
چۆن نێعمەتی خودایە
بیانوش ناگرم  بە دایە
تیکەکەم باش ئەجاوم
لە خواردن نەڕەنجاوم
سپاس دەکەم لە سەری
لە دایە و رۆزی دەری
قاپی خواردن جەم دەکەم
مسواک لە دانیش دەدەم

## خوێندەواری

من ڕۆڵەی کوردەواریم
ئاشق بە خوێندەواریم
وەشەم سەرمایەی ژینە
لە تێنووسم ئاژینە
دوژمنم دەتەزێنێ
موژدەی ئازادی دێنێ

بیروهۆشم وریایە
کاتم نادەم بە زایە
زۆر چالاک و بە زاتم
هۆی سەربەرزی وڵاتم
نایدەمە دەست بێگانە
جوانی ئەم نیشتمانە
خەڵکی دێهات و شاری
ناترسین لە هەژاری
لە ڕێ عیلم و زانیاری
دەچین بەرەو بەختیاری
سیس و لاواز بێ دوژمن
پیرۆز بێ میلەتی من

## پەلکە و دایکم

دو پەلکەی درێژ دێنە ناوشانم
دایکم گرتی بۆم قەزای لە گیانم
گوڵەپەپوولە لە بانی سەرم
جلی رەنگاورەنگ دەکاتە بەرم
دەم ڕازێنێتەو بە وێنەی پەری
شایی بێ یاکو ببمە سەفەری
سووری ڕوخسار و قاقای پێکەنین
بە بۆنەی تۆیە کە شادم لە ژین
کێ وێنەی دایە لەگەڵ مندایە
سۆز و مێهری ئەو هەدیەی خودایە
سەربەرز و شادبی تا کاتێ مابی
دوور لە پەژارە و ئێش و ئازار بی

## هەتاو

هەڵ دێ هەتاو لە ئاسۆ
پرشنگی دێ لەسەرخۆ
بە بزەی لێو دێتە دەر
جوانتر لە زێڕ و گەوهەر
لە دوا تارمای شەوێ
رووناکی دەر دەکەوێ
هەتاو گەرم و بەتینە
ڕووناکی مایەی ژینە
بۆ سرووشت و بۆ ئاوی
بە کەڵکە بە تەواوی
ڕۆژێ دی دێت ئەم جارە
سوودی لێی بەن یەکبارە

## قورئان

چەن خۆشە قورئان، خوێنم
وانەی لێی بەدەس بێنم
تێ بگەم لە پەیامی
لە فەرموودە و مەرامی
چۆن کەلامی خودایە
ڕێنمونی لەو دایە
قورئان تێیدایە دیاری
لە عیلم و لە زانیاری

دەمبا بەرەو ڕووناکی
بەرەو ڕەوشتی چاکی
بە سۆزی دڵ دەیخوێنم
تا لە ژین دانەمێنم
کاتی خوێندن قورئانم
ئارام دەگرێ ڕەوانم

## ئاكۆ

ماڵی ئاکۆ زۆر دووره
وا لەو گەڕەکە ژووره
ئەمڕۆ نەبوو لە کەلاس
مێزەکەی چۆڵ بوو لە باس
مامۆستا کە پێی زانی
چۆڵە جێگەومەکانی
پرسی لە ئێمە باسی
نەمانزانی بە ڕاسی

ئەمڕۆم زۆر پێ ناخۆش بوو
چونکە ئاکۆ ناخۆش بوو
کاتێ لە دەرس بوینەوە
بۆ سەردانی چوینەوە
بە دۆعا سەردانمان کرد
چەپکێ گوڵیشمان بۆ برد
شوکر ئاکۆ گەڕاوە
لە نەخۆشین پەڕاوە
وانەی ڕابردو و پێشوو
دووپاتمان کردەو بۆی زوو

## دیان

لەقولۆق بوو دیانم
ئازار ئەدا بە گیانم
دیانی تازە ڕواوە
کۆنە کەڵکی نەماوە
بە دەست یاکوو زوبانم
نایلەنگێنم دیانم

تا ئەو کاتەی دەکەوێ
دیانی تازە سەرکەوێ
ئەوانیش نادەم ئازار
بڕوێن وەک چرۆی بەهار
ڕێکومیزان و ڕاس بن
بە کەڵک بن تاکوو مابن

## دووچه رخه

خەزانەکەم پڕ بووە
پارەی زۆری تێ چووە
بەسیەتی دەی شکێنم
پێویستی پێ دەسێنم
پێی دەکڕم دوچەرخەیە
دەمێکە حەزم لێیە

دەیپارێزم بە جوانی
فەرمان و تایەکانی
تا فێر دەبم ئەو کاتەی
ناچمە شەقام یەک وادەی
بەڵام ئەگەر وریا بم
تووشی کارەسات نابم

## پشیله

میاو میاو پشیلەم
نەرمونۆڵ و نەشمیلەم
سەوزو شینە چاوانم
بە شوێن مشکا ئەڕوانم
قنجوقیتە سمێڵم
کەمێ بە مەکروفێڵم
دایم لە دەوری ماڵم
بۆ جوجەڵەی دەناڵم
پێم خۆشە بم دوێنی
گۆشتی نەرمم بۆ بێنی

حەزم لە شیر و ماسە
بۆم برێژە نێوکاسە
زوو زوو دەر ئەچم لە ماڵ
بۆ ژەمەنی ماڵەوماڵ
بەچکەی ورد و منالم
نەڕەوێنی لە پالم
شیرم خواردن ئەوانە
دەمرن نەیخۆن بزانە
بێ دەسەڵات و لالم
ڕەحمێ بکەن بە حالم

## وەرزو و مانگ

هەر ساڵێکمان چوار وەرزە
فێربوونی بۆمان فەرزە
خاکەلێوە و گوڵانە
ئاخری جۆزەردانە
مانگی وەرزی بەهارن
خۆشەویست و نازدارن
هاوین، پووشپەڕ، گەلاوێژ
خەرمانانیش دێتە پێش
مانگی وەرزی هاوینە
خۆرەتاوی بەتینە

ڕەزبەر و گەلاڕێزان
سەرماوەز دەچێ خەزان
مانگی وەرزی پاییزن
بۆ مەرگی گوڵان زیزن
بەفرانبار و ڕێبەندان
ڕەشەمێ ئاخر زستان
سەرما و سەهۆڵ بەندانە
بەرگی سپی لێی جوانە
مانگی چواروەرزی ساڵن
شادبن تێیدا نەناڵن

## کاتێ نەخۆشین

ئیستە کە زۆر نەخۆشم
دەرونیش بە پەرۆشم
پێویستم بە دەوایە
چون شیفا لە ئەو دایە
دوکتور هەرچێکی داوە
تا کاتێ وادەی ماوە
چاک بە کاری دەهێنم
لەش‌ساغی بە دەس بێنم
دایکی مێهرەبان و ژیر
هەرچێ بۆم دەکا تەکبیر
فەرموودەی بەسەر سەرم
چون دڵسۆزم و رێبەرم
ئەمری جێ‌بەجێ دەکەم
چۆن قازانجی لێی دەکەم
گەر گوێ لە دایکم نەگرم
بە دەردو ئێشەو دەمرم

## پەپوولە

پەپوولەی ئەویندارم
لە نێو باخ و گولزارم
دەفرم بە هێزی باڵم
دوور لە خەم و خەیاڵم
ژینم لە سەر گولاڵیە
فرینم بووە بە کایە
فەسڵی بەهار چەن جوانە
حەیفێ لای من مێوانە
رەنگاورەنگم زۆر تیایە
عومرم کەمە و پر مایە

## ساڵی تازە

دیسان هاتەوە نەورۆز
ساڵی تازەت لێ پیرۆز
بەسەر چوو بەفر و بۆران
کۆچی پێچاوە زستان
دەڕازێتەو بەهارم
بە ئەمری کردگارم

هاژەی ڕووبار و کانی
قەڵبەزەی ئاوەدانی
پەلەوەران دەخوێنن
نەغمەی ئازادی دێنن
شەوبو و چنوور و نەسرین
سەدان گوڵ وەک ئەو ڕەنگین
بەرگی سەوزەیش لە بەریان
گوڵان بۆ تاجی سەریان
دەنەخشێنن بەهاران
لە کویستان و نزاران
وەرزی گەشت و سەیرانە
پیرۆز لەم کوردستانە

## مامۆستا

مامۆستاکەم خۆش دەوێ
بێ ئەو دڵم ناسرەوێ
لێی تێ دەگەم بە جوانی
لە دەرس و وانەکانی
ڕەوشت بەرزیم پێ دەڵێ
تێدەگەم هەرچێ بڵێ
وتەکانی زۆر جوانە
مایەی ژین و ئیمانە

تۆ ئەستێرەی ئاسمانی
نیشاندەری ڕێمانی
نیگای چاوانی ڕوونت
خۆشەویستی دەروونت
وشەی ژینم فێر دەکەن
هەستم بۆ مەکتەب دەبەن
مامۆستا تاجی سەرمە
دڵسۆزترین ڕێبەرمە
دایم هەر وای لە یادم
لە پۆلەکەی زۆر شادم

## بووکە بارانێ

دروستی دەکەم بووکە بارانێ
بەشکم بباریٚ بەفر و بۆرانێ
لە کلکە بێلێ یا تەختە داریٚ
پێکی دەهێنم بووکی نازداریٚ
کراسێکی سوور دەکەمە بەری
کڵاوە زێڕێنە دەنێمە سەری

خۆشم جوان دەکەم بە کراسی نیلی
لەگەڵ هاوڕێیان نەسرین و لەیلی
ئەم پەڕ بۆ ئەو پەڕ لە کووچە و کۆڵان
دەسووڕێینەوە لەگەڵ کچۆڵان
بووکە بارانێ، بووکە بارانێ
خوایە بینێری تاوە بارانێ
ئەمە ڕەسمێکی کۆنی دێرینە
با بیپارێزین ئەی منالینە

## نێرگز

گوڵی بەهاریم
نێرگزم ناوە
بۆنم زۆر خۆشە
عەترم گوڵاوە
سپیە تاجەکەم
بۆسێکە باڵام
بۆ وەرزی بەهار
زۆر جوانە ئاڵام
لە پاڵی چەمدا

یاکو رووبارێ
سەر هەڵ دەهێنم
ئەوەڵ بەهارێ
بە بۆنێکی خۆش
خۆم دەنوێنم
پاشان گوڵێ‌تر
بەشوێنما دێنم
لە گوڵم چەپکێ
بەرەوە بۆ ماڵ
عەترم زۆر خۆشە
دەڕوا ماڵە و ماڵ

## زرێبار

گۆمێ شینی خنجیلەم
پڕ لە ماسی وردیلەم
ئاوی شیرینە چاوگەم
جێگەی سەیران و ڕاوگەم
زستان سەهۆڵبەندانە
دەوریشم دێهاتی جوانە

بەڕێی دەکەم مێوانم
لە خزمەتی هەموانم
لە شاری کوردستانم
دانیشتووی مەریوانم
ئەگەر زانیو تۆ ناوم
زرێباری پڕ ئاوم

## ڕێوی

ڕێوی بە مەکروفێڵە
بە شوێن نەچیردا وێڵە
دایمە هەوڵە بۆ سکی
بگرێ تیکەی ناسکی
ئەوڵ بە زوانی چەوری
دەیخلەتێنێ فەوری
تا کاتێ ڕامی دەکا
بەم شێوە سەیری دەکا
نەچیرەکە کاتێ کە زانی
قوڕگی گرتوە بە دانی
هیوای نامێنێ یەکجار
خۆیی ئەسپێری بە بەدکار
ڕێوی جێی باوەڕ نییە
ڕای چاکی لەسەر نییە

## ئاو

ئاوم مایەی حەیاتم
بۆ ژین ڕێگای نەجاتم
دەچم بۆ چۆم و ڕووبار
سەرەولێژ و بەرەوخوار
لە خاکی ڕووتەڵ و ڕەش
ئەدرۆشێنم گوڵی گەش
لە ڕووبار و لە کانی
لە شینگە و سەوزەڵانی
دێنم هەدیەی یەزدانی
لە ئاوەدانی و جوانی
سەربەرزی بۆ وڵاتم
مایەی هیوا و ئاواتم
دەڵێم ئەوەی بزانە
قازانجم بۆ هەمووانە
بێ من دونیا وێرانە
دەتۆش قەدرم بزانە

دو پەلکەی درێژ دێنە ناوشانم
دایکم گرتی بۆم قەزای لە گیانم
گوڵە پەپوولە لە بانی سەرم
جلی رەنگاوڕەنگ دەکاتە بەرم
دەم ڕازێنێتەو بە وێنەی پەری
شایی بێ یاکو ببمە سەفەری
سووری ڕوخسار و قاقای پێکەنین
بە بۆنەی تۆیە کە شادم لە ژین
کێ وێنەی دایە لەگەڵ مندایە
سۆز و مێهری ئەو هەدیەی خودایە
سەربەرز و شادبی تا کاتێ مابی
دوور لە پەژارە و ئێش و ئازار بی